زنجیرەی گەنجانی ئیسلام (٣)

# هۆکارەکانی نەبارینی باران

## لەکۆمەڵگای موسڵماناندا

نوسینی : خوبەیب تەوحیدی

بسم اللَّه الرحمن الرحيم

الحمدللَّه، وَسِعَ كلَّ شيء برحمته، وعمَّ كلَّ حي بفضله ومِنَّته وكَرَمـه، وخضعت الخلائقُ لكبريائه وعظمته، يُسَبِّح الرعدُ بحمده والملائكةُ من خيفته، أحمده -سبحانه- وأشكره، وأشـهد ألا إلـه إلا اللَّـه وحـدَه لا شريك له، في ربوبيته وألوهيته وأسمائه وصفاته، وأشهد أن سيدنا ونبينا محمدا عبداللَّه ورسوله، وخِيرته مِنْ خَلْقه، صلى اللَّه وسلم وبارك عليه وعلى آله وأصحابه، والتابعين وَمَنْ تَـبِعَهم بإحسـان إلى يـوم الـدين، وسلَّم تسليمًا كثيرًا.

بێگومان باران یەکێکە لـە نعیمەتـەکانی خـودای پـەروەردگار, بـاران یاخود ئاو بەتایبەت یەکێکە لەسەرچاوە گرینگـەکانی ژیـانی مـرۆڤ, بەداخەوە لەم چەند ساڵەی ڕابردوو برێکی کەم نەبێت باران نەباریوە یاخود زۆر تاخیر دەبێت,کە ئەوانەش هیچی بێ هۆکـار نیـە,بێگومان هۆکارەکەشی پەیوەندی بە هەڵکردنی با لە شەماڵ و یـاخود کـەش و هەوای دەریایی ناوەڕاستەوە نیە,بەڵکو پەیوەندی بە خودی خۆمان و کردەوەکانمانەوە هەیە بە پشتیوانی خودای پایە بەرز و میهرەبان لێرەدا باسی هۆکارەکانی نەبارینی باران و تاخیر بوونی باران دەکەم.

## هۆكارەكانی نەبارینی باران یاخود تاخیر بوونی لە كۆمـەڵگەی موسڵمانandا:

**یەكەم: زۆری تاوان و بێ فەرمانی كردنی خودا**

گەر بێت و سەیرێكی كار و كردەوەكانمان بكەین و بە دڵێكی ئیمانیەوە بە كردەوەكانماندا بچینـەوە بۆمـان دەردەكـەوێت كـە كردەوەكانمـان شایەنی ئەوە نین كە ببنە هـۆی ڕەزامەنـدی خـوا سـبحانە و تعـالی, كردەوەكانمان پڕیەتی لە سەرپێچی و لە ڕێ لادان.

كە ئەوانە گشتیان هۆكارن بۆ تاخیر بوون و نەبارینی باران و تـووش بوون بە بەڵا و نەهامەتی، وەك خوای تعالی لە قورئانـە پیرۆزەكەیـدا دەفەرمووێت: (وَمَا أَصَابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَـنْ كَثِيرٍ) الشورى [٣٠] واتە: (هەر بەڵاو نەهامەتیـەكتان بەسـەر هاتبێـت، ئـەوە دەرئـەنجامی ئـەو كـارو كردەوانەیـە كـە بـەئارەزووی خۆتـان دەتانكرد).

بێگومان نەبارینی بـارانیش یەكێكـە لـەو نەهامەتیانـەی كـە هـەموو بەهۆی زۆری تاوان و ئەو كار و كردەوە بێ شەرعیانەیە و دەرچوونە لە فەرمانەكانی خودا، با بیربكەینەوە ڕۆژانە چ تاوانگەلێك دەكرێت لە نێو موسڵمانandا!!

گەنجان و لاوانمان بەردەوامن لەسەر شوێنکەوتنی ڕێچکەکانی شەیتان بەردەوام وا لە باڕ و یانەکانن تا درەنگانی شەو، ئافرەتانن خەریکی خۆ ڕازاندنەوە و بێ فەرمانی خواین لە پۆشینی پۆشاکەکیانیان و خۆداپۆشینیان بە پۆشاکی شەرعی, گوێ لە گۆرانی و مۆسیقا دەگیرێت،بازارەکانمان پربووە لە تاوان,بێ پەیمانی و دزیکردن و خیانەت کردن, غەشکردن لە مامەڵکاندا...هتد کە بێگومان باسی تاوانەکانی ئەمرۆی نێو موسڵمانان بکرێت زۆر زۆری دەوێت بە بابەتێك و دوان تەواو نابێت.

دووەم:پشت هەڵکردن لە یادی خوا و لە دینەکەی:

هۆکارێکی تری تاخیر بوونی باران پشت هەڵکردنە لە یادی خوا و لە دینەکەی کە ئەمەش هۆکارێکی سەرەکیە، خوای گەورە لە قورئانەکەیدا دەفەرمووێت: (وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا ) طه:١٢٤. واتە: (ئەوەی ڕوو وەربگێڕێت لە بەرنامە و یادی خودا,بێگومان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی ترش و تاڵ و ناخۆش پێش دێت).

بێگومان پشت هەڵکردن لە زیکر و یادی خودا هۆکارێکە بۆ نەبارینی باران و دواکەوتنی، ڕۆژانە بەردەوام پشت لە زیکری خـوا دەکرێـت خەڵکی لە پێناو بەدەست هێنانی دنیـا قیامـەت و دینەکـەی خوایـان پشتگوێ خستووە گـەنجانمان لـە جیـاتی دەسـتگرتن بـە سـوونەتی پێغەمبەرەوە(صلی اللّٰه علیه وسلم) شوێن گاور و جولەکە و بێ بـاوەڕان کەوتوون, لە جێگەی بایەخدان بە عیلمی شەرعی و گرینگیـدان بە کتابەکەی خوای تاك و تەنیا کە قورئانە گرینگی دەدرێ بە کتێب و پەرتووکەکانی بێباوەران, ڕۆژانە بەردەوام چاودێری بڵاوکراوەکانیـان دەکرێت,خەڵکی لە جیات ئەوەی ئیش بە شەریعەتی خـودایی بکـەن پەنا بۆ یاسا و دەستوری بێ باوەڕان دەبەن,لە جیاتی ئەوەی منداڵەکان فێری ڕەوشتەکانی قورئان و فەرموودە بکرێن فێری سـەما و گـۆرانی وتنیان دەکەن...هتد, کە ئەو کردەوانە تێکڕای پشت کردنە لە دینەکەی خودا و یادو زیکری پەروەردگار.

سێیەم: نەدانی زەکات

پێغەمبەری خودا(صلى اللّٰه عليه وسلم) دەفـەرموویت: (وَلَـمْ يَمْنَعُـوا زَكَاةَ أَمْوَالِهِمْ إِلَّا مُنِعُوا الْقَطْرَ مِنَ السَّمَاءِ وَلَـوْلاَ الْبَهَـائِمُ لَـمْ يُمْطَـرُوا) حسن وهو في السلسلة الصحيحة برقم ١٠٦. ,واتە: (هەر کـاتێ کـە کۆمەڵی ئیماندااران وازیان لە زەکات دەرکردن هێنـا لـە ماڵـەکانیان دا ئەوا بارانیان لێدەگیرێتەوە لە ئاسمان,وە ئەگەر لەبەر ئاژەڵەکان نەبێت هەر بارانیان بۆ نابارێت).

یەکێکی تر لە هۆکارەکـانی نـەبارینی بـاران و تـاخیر بـوونی زەکـات نەدانی ماڵەکانمانە,کە زەکات یەکێکە لە پێـنج روکنـەکانی ئیسـلام و خوای گەورە لە چەندین ئایەت لە قورئانەکەیدا باسی زەکات دەکات وەك دەفەرموێت: ( وَأَقِيمُوا الصَّـلَاةَ وَآتُـوا الزَّكَـاةَ) النـور: ٥٦.واتـە: نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن وە زەکاتی ماڵەکانتان بدەن.

خوای گەورە  زەکاتی لەگەڵ نوێژدا باس کردووە وە لەچەندین ئایەتی تریش باسی زەکات و گـەورەیی زەکـات دەکـات, بـەڵام بـە داخـەوە موســـڵمانان کەمتەرخـــەمن لـــە پێـــدانی زەکـــاتی ســـەروەت و سامانەکانیان,بگرە زۆرێکیان بـە هـیچ شێوەیەك زەکـات نـادەن کـە ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە لە ئێستادا باران نابارێت یـاخود تـاخیر دەبێت وە یان دەبارێت بەڵام لە کاتی پێویست دانا.

**چوارەم: سوپاس نەکردنی خوا لەسەر ناز و نیعمەتەکانی.**

بێگومان کاتێك ئێمە سوپاسی خوای گەورە نەکەین لەسەر ئەو هەموو نیعمەتەی کە پێمانی بەخشیووە, بەتەنهایی نەیپەرستین ئـەوا خـوای گەورە ئەو ناز و نیعمەتەی بەسەریدا باراندووین و لێمان دەگۆرێت و برسیەتی و قات و قڕی و بێ بارانی ڕوو لە وڵاتەکەمان دەکات وەکـو خوای گەورە لە قورئانەکەیدا دەفەرمووێت:

(إِنَّمَا جُعِلَ السَّبْتُ عَلَى الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ )النحل:١٢٤. واتە: (خوای گەورە نمونەی دێیەك بۆموسڵمانان دەهێنێتەوە کە لە ئارامی و هێمنـی دا دەژیـان, وە خوای گەورە رزق و رۆزی فروانی دەڕژانـد بەسـەریاندا لـە هـەموو شوێنێکەوە,بەڵام کاتێك کوفریان کرد بە بەخششەکانی خوای گەورە و سوپاسگوزاریان نەکرد لەسەر نازو نیعمەتەکانی,خوای گەورە تـوشی برسێتی و ترسێکی زۆری کرد بە هۆی کردەوە خراپەکانیان).

هەروەها خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ( وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِنْ شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِنْ كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَـدِيدٌ )إبـراهيم:٧. واتـە: (ئەگەر ئێوە سوپاسگوزاریی نیعمەت و بەخششەکانی من بکەن,ئـەوا بێگومان نیعمەت و بەخششی خۆمتان بۆ زیاد دەکەم, بەڵام ئەگەر بێ باوەڕ بن و ئەوا بەراستی سزدانی من زۆر سەخت و بەتینە.

**کەواتە سوپاسکردنی  خودای گەورە لەسەر نازو نیعمەتەکانی کە پێی بەخیشوین هۆکارێکە بۆ خۆش گوزەرانی و زیاد بوونی ڕزق و رۆزی بەڵام بە پێچەوانەوە کاتێك پشت هەڵکەین و سوپاسی خـوای گـەورە نەکەین لەسەر ئەوەی پێی بەخشیوین و بەتەنها نەی پەرستین, ئـەوە بێگومان خوای گەورە ئەو ڕزق و رۆزیەمان لێ دەگۆرێت بۆ تـرس و قات قری بێ بارانی.**

**ئەوانەی لەسەرەوە باسکران کۆمەڵێك بەڵگە بوون لەسەر هۆکارەکانی نەبارینی باران وە یاخود تاخیر بوونی،بێگومان ئەگەر بێـت و لەسـەر ئەو کار و کردەوانەی سـەرەوە بـەردەوامبین و نەگەڕێینـەوە بـۆ لای خوای گەورە ئەوە بەڵاو موسیبەتی زۆر گەورەترمان بۆ دێتەپێش-پەنا بەخوا-, وە هەوەرها ژیان و گوزەرانمان زۆر لەوەی ئێستا لە بێبارانیدا دەیچێژین ناخۆشتر دەبێت, بەڵام هەر کاتێـك ڕوومـان لـە دینەکـەی خودا کردەوە و گەراینەوە بۆ لای خوا ئەوا بێگومان خوای گەورەش رزق و رۆزی و بارانی رحمەتی خۆیمان بەسەر دەبارێنیت.**

## کەواتە لە هۆکارەکانی باران بارین

**یەکەم: پارانەوە لە خوا و داوای لێخۆش بوون کردن**

بێگومان بەوە دەبێت کە بگەڕێینەوە بۆ دینەکەی خودا و دەست بگرین بە قورئـان و سـوننەت,خوای میهرەبـان بـەر ەحـم و بـەزەیی خـۆی خۆشگوزەرانی و ئاوەدانی دەگـەڕێنێتـەوە بـۆ وڵاتەکـەمان و بـارانی رەحمەتی خۆی بەسەرماندا دەبارێنێت,جا یەکێك لە هۆکارەکانی باران بارین و خۆشگوزەرانی گەرانەوە و داوای لێخۆش بوونکردنـە وەکـو خوای گەورە لـە قورئانەکەیـدا لەسـەر زمـانی نـوح (علیـە السـلام) دەفەرمووێت: ( فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَارًا وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَلْ لَكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَلْ لَكُمْ أَنْهَارًا) نوح:١٠-١١-١٢. واتە: (بەردەوام پێم دەگوتن,ئێوە داوای لێخـۆش بوون لە پەروەردگارتان بکەن چونکە بەراستی ئەو زاتێکی لێخۆشبووە ,بارانتان بە لێزمە و خوڕەم لە ئاسمانەوە بۆ دەبارێنێت,ماڵ و سامان و نەوەتان پێ دەبەخشێت, هاوڕێ لەگەڵ باخ و باخاتدا,ڕووبار و چـەم جۆگەتان بۆ بەدی دەهێنێت).

بێگومان گەڕانەوە و داوای لێخۆش بوون کـردن یەکێکـە لـە هۆکـارە گەورەکانی خۆش گـوزەرانی و ڕزق و رۆزی و بـارینی بـاران, بۆیـە پێویستە بەردەوام بگەڕێینەوە بۆ لای خودا و داوای لێخـۆش بـوونی لێبکەین چونکە بەڕاستی ئێمە هەژار و بێ دەسەڵاتین و پێویستمان بـە خوایە وە خوای گـەورە بـێ پێویسـت و بـێ نیـازە بـە ئێمـە وەك لـە قورئانەکەیدا دەفەرمووێت: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنْتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ) فاطر:١٥. واتە: ئەی خەڵکینە ئێوە هەژار و نەدارن و هەمیشـە ئاتـاجی خودان(لـە هـەموو کـات و شـوێنێك پێویسـتان بەخودایە) وە خوا بێ نیاز و سوپاسکراوە).

دووەم: تەقوای خوا بکەین لە شوێنك و هەر کاتێکیش بین

یەکێکی تر لە هۆکارەکانی رزق و رۆزی و خۆشگوزەرانی ئەوەیە کـە پێویستە بەردەوام تقوای خوا بکەین و خودا بە تەنها بپەرستین جا لە هەر شوێن و کاتێکدا بێت یان لە هەر باردۆخێکدا بێت,هـەر کاتێـك بەڕاستی خوامان بەرست و هاو بەشمان بـۆ بڕیـار نـەداو لـە هـەموو شتێکدا بچوك و گەورە پشتمان بە خوا بەسـت ئـەوا بـێ گومـان خـوا گەورە رزق و رۆزیمان بـۆ زیـاد دەکـات و بـارانی رەحمـەتی خـۆی بەسـەرماندا دەبارێنێـت,وەك خـوای گـەورە لــە قورئانەکەیـدا

دەفەرمووێت: (وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا  وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ) الطلاق:٢-٣. واتە:(هەرکەسێ تقوای خودا بکات ئەوا خوای گەورە دەرگای خێری لێدەکاتەوە وە ڕزق و رۆزیش دەدات لەلایەکەوە کە هەر بەخەیاڵیشدا نەهاتووە).

سێیەم: سوپاس گوزاری خوا بکەین بە بەردەوامی

یەکێکی تر لەو هۆکارانەی کە دەبێتە هۆی باران بارین سوپاس کردنی ناز و نیعمەتەکانی خوای پایە بەرزە, وەکو خوای گەورە لە ئایەتەکەی سەرەوەدا دەفەرمووێت: (لَئِنْ شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ) واتە:(ئەگەر ئێوە سوپاسگوزاریی نیعمەت و بەخششەکانی من بکەن,ئەوا بێگومان نیعمەت و بەخششی خۆمتان بۆ زیاد دەکەم).

بۆیە پێویستە لەسەرمان بەردەوام سوپاسی خودا بکەین لەسەر ئەو هەموو ناز و نیعمەتەی کە پێی بەخیشووین و بەسەرماندا دەیبارێنێت,گەربێت و باسی نیعمەتەکانی خودا بکەین لە ژماردن نایات و بێ حیسابن, بەڵام بێگومان هەرکاتێك سەرپێچی بکەین و پشت هەڵبکەین ئەوا خوای گەورە ناز و نیعمەتەکانی خۆیمان لێدەگرێتەوە.

لەکۆتایدا برای موسڵمانم بزانە...
خۆشگوزەرانی ئێمە هەر لە دونیادا پێش ئاخیرەت لە خواپەرستی دایە نەك وابزانین خۆشگوزەرانی لە گوناه و تاوان و سەرپێچی کردنی خودا دایە

وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنْ الْحَمَدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ



تویشوو
پرۆژەیەکی تەواو سەربەخۆی ئیسلامییە و لە پێناو بەرز ڕاگرتنی شەریعەت و بەرنامەی خوای گەورە دژی هەموو ڕێچکە خوارو فیکرە سەر لێشێواوەکان دەوەستێتەوە.
کتێبخانەی تویشوو بە بەڵگەی قورئان و سوننەت بانگەوازی خوایی دەکات.


KTIBXANY_TWESHU

